## بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين، والعاقبة للمتقين، ولا عدوان إلا على الظالمين، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له الملك الحق المبين، وأشهد أن محمدا عبده ورسوله إمام الأولين والآخرين، أما بعد:

### ١-نیەت هێنان :

یەك كار كە بكرێی پێش دەست پێكردنی نوێژ بریتیە لە نیەت هێنان ئەویش نیەت هێنانە بەدل لەبەر فەرموودەكەی پێغەمبەرﷺ (**إنَّمـا الأَعـمالُ بالنِّيَّـات، وإِنَّمَّـا لِكُـلِّ امـرِئٍ مَـا نَـوَى**)[١] (كرداربە گویرەی نیازە ئینسان لەكردەوەدا نیەتێكی هەبی بەگوێرەی نیەتەكەی سزا و پاداشت وەردەگرێی) .

وە نیەت هێنان دەبێت بەدل بێت نەكو بە دەم چونكە وتنی بەدەم كارێكی داهێنراوە هیچ دەلیلێكی لەسەر نیە كەوا كرابێت .

.......

### ٢- وتنی(الله أكبر):

وتنی (**الله أكبر**) بەدەم و بەزەمان ، ئەمەش دەست پێكی نوێژكردنە وتنی (**الله أكبر**) لەبەر ئەم فەرموودەیە:

[١] : أخرجه البخاري، كيف كان بدء الوحي إلى رسول الله -صلى الله عليه وسلم-؟ (٦/١)، رقم: (١).

عـــەلی (ڕەزای خـــوای لـــێ بێـــت) دەفـــەرموویت : پێغەمبـــەری خـــوا ﷺ دەفـەرمووێی (مفتـاح الصـلاة الطهـور وتحريمهـا التكبـير وتحليلهـا التسـليم)[٢] واتــە : کلیلــی نــوێژ پاکردنەوەیــە ، وە حــەرام کــردنیش (**الله أکــبر**)[٣] تــەکبیرە کردنە ، وە حەلاڵ کردنیش سەلام دانەوەیە .

## ٣-دوعای دەستپێك :

ئـەم دوعایـە دەخـوێنرێی لـە دوای وتنـی (**الله أکـبر**) کـە باشـترین دوعایـە کـەوا زانایان باسی دەکەن بەڵگەی زۆری لەسەرە کە  کە ئەم دوعایەیە .

(اللهـم بَاعِـدْ بَيْنِـي وَبَـيْنَ خَطَايَـايَ كـما بَاعَـدْتَ بـين الْمَشْرِـقِ وَالْمَغْـرِبِ اللهـم نَقِّنِـي مـن الْخَطَايَـاي كـما يُنَقَّـى الثَّـوْبُ الْأَبْـيَضُ مـن الـدَّنَسِ اللهـم اغْسِـلْ خَطَايَايَ بِالْمَاءِ وَالثَّلْجِ وَالْبَرَدِ)[٤] .

ماناکەی :

(**اللهم بَاعِـدْ بَيْنِـي وَبَـيْنَ خَطَايَـايَ**) خوایـە تاوانـەکانم لـێ دوور بخـەرەوە . (**كـما بَاعَـدْتَ بـين الْمَشْرِـقِ وَالْمَغْـرِبِ**) هـەروەك چـۆن ڕۆژهـەڵات و ڕۆژ ئـاوات لێـك دوور خسـتۆتەوە ، (**اللهـم نَقِّنِـي مـن الْخَطَايَـاى**)خوایـە لەتوانـەکانم خـاوێنم بکەیتــەوە ، (**كـما يُنَقَّـى الثَّـوْبُ الْأَبْـيَضُ مـن الـدَّنَسِ**)هـەروەك چـۆن جـل و

---

[٢] : ومسند الامام احمد(١٠٠٦/١-١٠٧٢/١-١٤٧٠٣/٣)،

[٣] :مەبەست پێێ ئەو وتە و کردەوانەیە کەوا حەرام کراوە بوترێی لەناو نوێژدا .

[٤] : أخرجه البخاري في كتاب الأذان، باب ما يقول بعد التكبير برقم ٤٤. ومسلم في كتاب المساجد ومواضع الصلاة، باب ما يقال بين تكبيرة الإحرام والقراءة برقم ٥٩٨.

بـەرگی سـپی لـە پـیس خـاوێن دەکرێتـەوە ، (**اللهـم اغْسِـلْ خَطَايَـايَ**)خوايـە لەتاوانەکانم بمشۆرەوە ، (**بِالْمَاءِ وَالثَّلْجِ وَالْبَرَدِ**)بە ئاو و بەفر و تەزرە.

................

## ٤-إستعاذ به بەخوای گەورە :

پـێش خوێنـدنی سـورەتی (الفاتحـه) واسـونەت کـەوا پـەنا بگریـی بـەخوای گەورە لە شەیطانی ترۆ کراو ونەفرەت لێکراو . ئەم وردە دەخوێنی :

(**أَعُـوذُ بـالله مـن الشـيْطانِ الـرجِيمِ مـن هَمْـزِهِ، ونَفْثِـهِ، ونَفْخِـهِ**)[٥] واتـە : پـەنا دەگـرم بـەخوا لـە شـەیتانی دوو خـراوە لـە میهرەبـانی خـوا ، وە لەشـێتیو خـۆ بەزلزانی و قسەی خراپی شەیتان.

..........................

## ٥-خوێندنی سورەتی (الفاتحه):

خویندنی فاتیحە فەرزە و ئەبێ بخوێنرێی لە هەموو رکاعەتەکاندا .

پێغەمبـەرﷺ دەفـەرمووی : (**لا صـلاة لمـن لم يقـرأ بفاتحـة الكتـاب**)[٦] واتـە : نـوێژی نی یە کەسێك فاتیحە نەخوێنی .

[٥] : أبو عبيد الهروي في غريبه (٢/٤٣٩):

[٦] : متفق عليه

(بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ (١)
الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ (٢) الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ (٣) مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ (٤) إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ (٥) اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ (٦) صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ (٧)).

ماناکەی:

(بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)، بەناوی خوای بەخشەندە و میهرەبان ، (الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ)سوپاس بۆ خوای پەروەردگاری هەموو جیهانیان ، (الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) کە بەخشندە و میهرەباە ، (مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ) پاشا و خاوەنی رۆژی پاداشت و سزایە ، (إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ)هەر تۆ دەپەرستین و داوای یارمەتیش هەر لەتۆ دەکەین، (اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ) ڕێنوماییمان بکە بۆ سەر ڕێگایی ڕاست ، (صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ)ڕێگای ئەو پێغەمبەرانەی کە ڕێنوماییت کردوون ، (غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ)نەك ڕێگای جوولەکە و گاورەکان و هاوشێوەی ئەوان
.

..............

## ٦- (امين) كردن :

لەدوای تەواو بوون و خوێندنی سورەتی (الفاتحە) پێوستە و واجبە کەوا (امين) بلێت .

ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) دەفـەرموویی : پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەفـەرمووێ : (إِذَا قَـالَ الْإِمَـامُ ( غَـيْرِ الْمَغْضُـوبِ عَلَـيْهِمْ وَلَا الضَّـالِّينَ ) فَقُولُـوا آمِينَ فَإِنَّهُ مَـنْ وَافَـقَ قَوْلُـهُ قَـوْلَ الْمَلَائِكَـةِ غُفِـرَ لَـهُ مَـا تَقَـدَّمَ مِـنْ ذَنْبِـهِ)[٧] واتـە : ئەگـەر پـێش نـوێژ وتـی (غَـيْرِ الْمَغْضُـوبِ عَلَـيْهِمْ وَلَا الضَّـالِّينَ) ئـەوە ئێـوەش بلـێن (امـین) جـا هەرکەسـێك وتەکـەی لەگـەل وتـەی مەلائیکەتـەکان جـووت بوو ئەوە خوای گەورە لەهەموو تاوانەکانی پێشووی خۆش دەبێ .

### ماناکەی :

(امین) خوایە ئەم پارانەوەیەمان لێ گیرا بکەیت .

## ٧-خوێندنی سورەتێکی تر :

هــەر ســورەتێکی تــر ئــەتوانرێی بخــوێنرێی . ئێســتا ئێمــە بۆنمونــە ســورەتی (الإخلاص) دائەنێن و مانای ئەکەین :

(بِسْـمِ اللَّهِ الـرَّحْمَنِ الـرَّحِيمِ) (قُـلْ هُـوَ اللَّهُ أَحَـدٌ (١) اللَّهُ الصَّـمَدُ (٢) لَـمْ يَلِـدْ وَلَـمْ يُولَـدْ (٣) وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ (٤)).

### ماناکەی :

(بِسْـمِ اللَّهِ الـرَّحْمَنِ الـرَّحِيمِ)، بـەناوی خـوای بەخشـەندە و میهرەبـان ،(قُـلْ هُـوَ اللَّهُ أَحَـدٌ) بلـێ خوایـە یـەك و هـاوەلی نییـە ، (اللَّهُ الصَّـمَدُ) خـوا مەبەسـتیانە ، (لَـمْ

[٧] رواه البخاری

يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ) کەسی لێ نەبووە و لەکەسیش نەبووە ، (وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ) وە هیچ کەس هاو وێنەی خوا نییە .

..................

**٨-چوونە رکوعەوە :**

پاش تەواوبوونی نوێژ خوێن لەدوای تەواو بوونی سورەتەکەیتردا ئەوا نوێژ خوێن دەچێتە رکوعەوە و دەلێت (**الله أكبر**) لە ڕکوعدا دە لێت :

(سبحان ربي العظيم وبحمده)

ماناکەی :

(سبحان ربي العظيم وبحمده)پاکی و بێگەردی بێ شەریکی بۆ پەروەردگاری گەورەم و سوپاسی دەکەم .

.......................

**٩-پاشان سەربەرز دەکەیتەوە :**

سەربەرز دەکەیتەوە و لە روکوع هەلدەستیەوە و رادەوەستیت و ئەلێت :

(سمع الله لمن حمده، ربنا ولك الحمد)

ماناكەی:

(سمع الله لمن حمده) خوا پارانەوەی ئەو كەسە گیرا دەكات كە سوپاسی دەكات،( ربنا ولك الحمد) ئەی پەروەردگارمان هەموو سوپاسێك بۆتۆیە .

.....................

**١٠-خوێندنی دوعایەك:**

لەدوای هەلسانەوە وە لەركوع دوعایەك دەخوێنێت و ئەلێت :

(**حَمْدًا كَثِيرًا طَيِّبًا مُبَارَكًا فِيهِ كَمَا يُحِبُّ رَبُّنا ويرَضي** )[٨] واتە سوپاسێكی زۆر و پاك و بەبەرەكەت ،كە خوا پێی خۆش بێت و پێی رازی بێت .

.....................

**١١-چوون بۆ سوجدە :**

دوای هەلسانەوەی لە ركوع ئینجا نوێژ خوێن ئەچێت بۆ سوجدە و (**الله أكبر**) دەكات و لە سوجدەدا ئەمێنێتەوە و حەوت ئیسقانی بە زەویدا ئەكەوێی ئەوانیش (**لەسەر توێل ، وەلوتی ، وە هەردوو دەستی لە لەپی ، هەردوو ئەژنۆ و پەنجەكانی هەردوو پێی** )[٩] وە تێدا ئەمێنێتەوە بەبێ جولە كردن تێدا و ئەلێت :

(سبحان رب الأعلی و بحمده)

---

[٨] : الكتب » عمل اليوم والليلة لابن السني » بَابُ : مَا يَقُولُ إِذَا انْتَهَى إِلَى مَجْلِسٍ ، رقم الحديث : ٤٣٩

[٩] :مسلم : (٤٩٠\٣٥٤\١)

ماناكەی:

(سبحان رب الأعلى و بحمده)پاكی بۆ پەروەردگارم ، كە لەهەمووان بەرزترە و سوپاسی دەكەم و بێ هاوەل و بێ كەم و كورییە .

................

**١٢-هەلسانەوەلە سوجدە:**

پاشان هەلدەستیتەوە و دەلێت (**الله أكبر**) و دائەنیشیت و ئەلێت :

(اللهم اغفر لي وارحمني واجبرني وارفعني واهدني وعافني وارزقني)[١٠]

ماناكەی:

خوایە لێم خۆش بە و میهرەبانیتم پێ ببخشە و كەمو كوریم پر بكەرەوە و پلەم بەرز بكەرەوەو رێنمویم بكە و تەندروستیم باش بكە و رزقم پێ ببەخشە.

*پاشان دەچیتەوە بۆ سوجدە و دەلێت (**الله أكبر**) پاشان وەكو جاری یەكەم دەلێت :

(سبحان رب الأعلى و بحمده).

...................

١٣- خوێندنی تەحیات :

---

[١٠] : رواه أبو داود (٨٥٠)

لـەدوای تـەواو كردنـی ركعـاتی یەكەمـدا دواتـر ئـەم كـردەوە و وتانـەی باسـمان كـرد ئـەنجامت دا لـە ركعـاتی دووەمیشـدا ئـەنجامی ئـەدەیت بـەلام لـە دووەم سـوجدە بـردن دا كاتێـك هەلدەسـتیتەوە و ئـەلێت (**الله أكـبر**) ئـەم جـارە هەلناسـتیتەوە و بـەلكو دا ئەنیشـیت و تـەحیات ئـەخوێنی لەبـەر ئـەم فەرموودەیەشدا :

إبـن مسـعود (رەزای خـوای لـێ بێـت) دەفـەرمووێ : (كُنَّـا نَقُـولُ فِي الصَّـلَاةِ خَلْـفَ رَسُـولِ اللَّهِ ﷺ : السَّـلَامُ عَـلَى اللَّهِ ، السَّـلَامُ عَـلَى فُـلَانٍ ؛ فَقَـالَ لَنَـا رَسُـولُ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ يَـوْمٍ : " إِنَّ اللَّهَ هُـوَ السَّـلَامُ فَـإِذَا قَعَـدَ أَحَـدُكُمْ فِي الصَّـلَاةِ فَلْيَقُـلْ التَّحِيَّـاتُ لِلَّهِ وَالصَّـلَوَاتُ وَالطَّيِّبَـاتُ السَّـلَامُ عَلَيْـكَ أَيُّهَـا النَّبِـيُّ وَرَحْمَـةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُـهُ السَّـلَامُ عَلَيْنَـا وَعَـلَى عِبَـادِ اللَّهِ الصَّـالِحِينَ فَـإِذَا قَالَهَـا أَصَـابَتْ كُـلَّ عَبْـدٍ لِلَّهِ صَـالِحٍ فِي السَّـمَاءِ وَالْأَرْضِ أَشْـهَدُ أَنْ لَا إِلَـهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَشْـهَدُ أَنَّ مُحَمَّـدًا عَبْـدُهُ وَرَسُـولُهُ ثُـمَّ يَتَخَـيَّرُ مِـنْ الْمَسْـأَلَةِ مَـا شَـاءَ . " )[١١] واتـە : ئێمـە لەپشـت پێغەمبـەری خـواوە (صـلى الله علیـه وسـلم) نوێژمـان دەكـرد دەمـانوت (السَّـلَامُ عَـلَى اللَّهِ ، السَّلَامُ عَـلَى فُلَانٍ)جـا پێغەمبـەری خـوا ﷺ رۆژێكیـان فـەرمووی : بەراسـتی خـوای گـەورە خـۆی (السـلام)ە ، جـا ئەگـەر یـەكێكتان دانیشـتن لـە نوێژەكـەی بـۆ تـەحیات خوێنـدن ئـەوە بابلێـت (التَّحِيَّـاتُ لِلَّهِ وَالصَّـلَوَاتُ وَالطَّيِّبَـاتُ السَّـلَامُ عَلَيْـكَ أَيُّهَـا النَّبِـيُّ وَرَحْمَـةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُـهُ السَّـلَامُ عَلَيْنَـا وَعَـلَى عِبَـادِ اللَّهِ الصَّـالِحِينَ)جا ئەگـەر ئـەوە بلێـت ئـەوا هـەموو بەندەیـەكی پیـاو چـاكی خـوای گـەورە دەگرێتـەوە لـە ئاسـمان و زەویـدا (أَشْـهَدُ أَنْ لَا إِلَـهَ إِلَّا اللَّهُ

---

[١١] ::رواه البخاری : (١١\٥٦\٦٢٦٥)

وَأَشْـهَدُ أَنَّ مُحَمَّـدًا عَبْـدُهُ وَرَسُولُهُ)پاشـان هـەرچی دوعایـەك هەلـدەبژرێت بـا بیکات .

**وە سەلاوات دان لەناو نوێژدا لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ رووکنە .**

فوضـالەی کـوری عوبێـد (رەزای خـوای لـێ بێت)دەگێرتـەوە کـەوا پێغەمبـەری خـوا ﷺ پیـاوێکی بینـی نـوێژی کـرد سـوپاس و ستایشـی پـەروەردگاری نـەکرد و سـەلاواتی لەسـەر پێغەمبـەری خـوا ﷺ نـەدا و نوێژەکـەی تـەواو کـرد ،جـا پێغەمبـەری خـوا ﷺ فـەرمووی (عَجِـلَ هَـذَا)واتـە : ئەمە پەلـەی کـرد ، جـا بـانگی کـرد و بـە ئـەو و کـەسـانی تریشـی فـەرموو : (إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ فَلْيَبْـدَأْ بِتَحْمِيـدِ اللَّهِ وَالثَّنَـاءِ عَلَيْـهِ ثُـمَّ لِيُصَـلِّ عَـلَى النَّبِـيِّ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثُمَّ لَيَدْعُو بَعْدَ مَا شَـاءَ )[12] واتـە : ئەگـەر یـەکێکتان نـوێژی کـرد بـا بـە (تمحيـد)ی پـەروەردگاری دەسـت پـێ بکـا ، وە ستایشـی لەسـەر بکـا ، وە سـەلاوات لەسـەر پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـدا ، پاشـان بـا داوای هـەر شـتێك بکات کە ویستی لێیەتی .

ئینجا تەحیات دەخوێنی و دەلێت :

(التَّحِيَّـاتُ لِلَّهِ وَالصَّـلَوَاتُ وَالطَّيِّبَـاتُ السَّـلاَمُ عَلَيْـكَ أَيُّهَـا النَّبِـيُّ وَرَحْمَـةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُـهُ السَّـلاَمُ عَلَيْنَـا وَعَـلَى عِبَـادِ اللَّهِ الصَّـالِحِينَ ، أَشْـهَدُ أَنْ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَشْـهَدُ أَنَّ مُحَمَّـدًا عَبْـدُهُ وَرَسُـولُهُ اللهـم صـل علـى محمـد وآل محمـد وبـارك

[12] :صحيح النسائی: (١٢١٧)

**علـى محمـد وآل محمـد كـما صـليت وباركـت علـى إبـراهيم وآل إبـراهيم إنـك حميد مجيد).**[١٣]

ماناكەی:

(**التَّحِيَّـــاتُ لِلَّهِ وَالصَّـــلَوَاتُ وَالطَّيِّبَـــاتُ**) گـــەورەیی و مانـــەوە و ســـەروەت و بـــەرزی و شـــكۆداری هـــەر بـــۆ خوایـــە وە هـــەروەها نـــوێژ و كـــردەوە و ووتـــە باشـــەكانمان هـــەر بـــۆ ئـــەوە، (**السَّـــلَامُ عَلَيْـــكَ أَيُّهَـــا النَّبِـــيُّ وَرَحْمَـــةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُـــهُ**)ســـەلام و میهرەبـــانی و بەرەكـــەتی خـــوا لەســـەر پێغەمبـــەری خـــوا ﷺ بێت ، (**السَّـلَامُ عَلَيْنَـا وَعَـلَى عِبَـادِ اللَّهِ الصَّـالِحِينَ**)سـەلامی خـوا لەسـەر ئێمـە و هـەموو بەنـدە چاكـەكانی خـوا بێـت ، (**أَشْـهَدُ أَنْ لَا إِلَـهَ إِلَّا اللَّهُ**) شـايەتی دەدەم كـە هـيچ خودايـەك شايسـتەی پەرسـتن نييـە تـەنها (**اللَّهُ**) نـەبێت ، (**وَأَشْـهَدُ أَنَّ مُحَمَّـدًا عَبْـدُهُ وَرَسُـولُهُ**) وە شـايەتی دەدەم كـە موحەمـەديـش ﷺ بەنـدە و پێغەمبەری خوايـە ، (**اللهـم صـل علـى محمـد وآل محمـد**) خوايـە پلـە و پايـەی پێغەمبـەر موحەمـەدﷺ و شـوێنكەوتوانی بـەرز راگريـت ،( **وبـارك علـى محمـد وآل محمـد**) وەبەركـەت برژێـت بەسـەر پێغەمبـەر موحەمـەد ﷺ وشـوێن كـەوتوانی ، (**كـما صـليت وباركـت علـى إبـراهيم وآل إبـراهيم**)هـەروەك پلـە و پايـەی پێعەمبـەر إبراهيم(عليـه السـلام) و شـوێن كـەوتوانيت بـەرز راگـرت و

---

[١٣] : تێبینیەك : دەربارەی (**السَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ**) عبدالرزاق دەڵێ : إبن جوريج هەوالی پێداوم دەڵێت عطاء خەبەريی پێداوم كە هاوەڵان لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ دەيانوت (**السَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ**) بەلام كەوەفاتی كرد دەيانوت (السلام على النبى )ئەمە ئيسناد و روايەتێكی صەحيحە. وە عائيشە (رەزای خوای لێ بێت هاوەڵانی فێری تەحيات خوێندن دەكرد و پێی دەگوتن بلێن : (السلام على النبى) . رواه السراج فى مسنده ج:١١٩-٢.

بەركـەتت بەسـەردا رشـتن، (**إنـك حميـد مجيـد**) بەراسـتی تـۆ سـوپاس كـراو و خاوەنی گەورەیت .

................

## ١٤- پەناگرتن له چوار شت :

واسـونەته كـەوا ئـەم دوعایـه بخـوێنرێی كـەوا خـۆت پـەنا ئـەدەی بـه خـوای گـەوره لـەچوار شـت . وه ئـەم دوعایـەش كۆمـەڵێكی زۆری زانایـان بـەواجبیان زانیوه چونكه پێغەمبەری خواﷺ هەردەم كردوویەتی .

ئـەبو هـورەیره (رەزای خـوای لـێ بێـت) دەفـەرمووێی :پێغەمبـەری خـواﷺ فەرموویەتی (إذا فـرغ أحـدكم مـن التشـهد الأخـير فليتعـوذ بـالله مـن أربـع مـن عـذاب جهـنم ومـن عـذاب القـبر، ومـن فتنـة المحيـا والمـات، ومـن شر المسـيح الـدجال)[١٤] واتـه : یـەكێك لـه ئێـوه كـه لەتـەحیات خوێنـدنی كۆتـایی بـووەوه بـا پـەنابگرێی بـەخوای گـەوره لـه چـوار شـت : لەسـزای دۆزەخ ، لەعـەزابی گـۆر ، لەفیتنه و ئاشوبی زیندو مردو ، له شەرو نەگبەتی دەجال.

ئەم دوعایه دەخوێنێت كه دەلێت :

**( اللَّهُـمَّ إِنِّي أَعُـوذُ بِـكَ مِـنْ عَـذَابِ جَهَـنَّمَ ، وَمِـنْ عَـذَابِ الْقَـبْرِ ، وَمِـنْ فِتْنَـةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ ، وَمِنْ شَرِّ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ)**

[١٤] :رواه مسليم

ماناکەی :

(**اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ جَهَنَّمَ** ) خوایە من پەنا بەتۆ دەگرم لەسزای دۆزەخ، (**وَمِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ** )وە لەسزای گۆر، (**وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ**) وە لەشەری دونیا و شەری دوای مردن ، (**وَمِنْ شَرِّ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ**)وە لەشەری مەسیحی دەجال .

..................

## ١٥- سەلام دانەوە :

دوای خوێندنی تەحیات و پەنا گرتن لە چوارشت بە خوای گەورە، ئەوا ئەو نوێژ خوێنەکە سەلام ئەداتەوە و دەلێت (السلام عليكم ورحمة الله )

جا ئەمەش پێغەمبەری خوا ﷺ جاری وا هەبووە دوو سەلامی داوەتەوە هەروەکو إبن مسعود(رەزای خوای لێ بێت) باسی کردوە کە ئەبو داود لە صەحیحەکەیدا بە ژمارە (٨٧٨)هێناویەتی .

وەجاری واش هەبووە یەك سەلامی داوەتەوە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەروەکو لە عائیشە(رەزای خوای لێ بێت)باسی کردوە و ترمزی لە صەحیحەکەیدا هێناویەتی بە ژمارە (٢٤٢).

(وصلى الله وسلم على نبينا محمد ، وعلى آله وصحبه أجمعين)